


# وەقایعی کوردستان

رۆژنامەی رەسمیی حکومەتی هەرێمی کوردستانە - وەزارەتی داد دەری دەکات

ژمارە (٣) سالی یەکەم ١٥ / ٦ / ٢٠٠٠ز "٤"ی گولانی ٢٧٠٠ی کوردی / "١٠" ربیع الأول ١٤٢١ی کۆچی


## لەم ژمـارەیـەدا :




ناونیشان :هەولێر باڵەخانەی وەزارەتی داد

( ٤٣٥١:٤٣٥٢:٤٣٥٣:٢٠٥١٢ )

## بە ناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

**بە ناوی گەلەوە**
**ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق**

**ژمارە : ١٢**
**مێژووی بڕیار : ٢٠٠٠/٥/٢١**

## " بریـــــار "

پشت بە و دەسەڵاتەی کە بە پێی برگە (٣)ی مادده (٢) لە یاسای ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٧پێمان دراوە و لە سەر ئەو بنەمایەی کە ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان عێراق لە دانیشتنی ڕۆژی ١٩٩٩/٥/٢١ یدا یاساکاری کردووە بریاری دەرهێنانی ئەم بریارەی خوارەوەماندا :

١. بریاری ژمارە (١٢)ی ڕۆژی ١٩٩٩/٩/٢٢ ، هەر لە ڕۆژی تەواو بوونی کارپێکردنیەوە بۆ ماوەی یەك ساڵی دیکەش کاری پێ بکرێت .
٢. دەبێ وەزیرە پەیوەندداره‌کان حوکمەکانی ئەم بریارە جێبەجێ بکەن .
٣. ئەم بریارە لە ڕۆژی دەرهێنانییەوە دەخرێتە کار و ، لە ڕۆژنامەی رەسمیشدا بلاّو دەکرێتەوە .

**د. ڕۆژ نــوری شاوەیس**
**سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق**

## ژمـــارە :٣٤٣

# " فەرمـــانی وەزاری "

لە پێناو پیادەکردنی ماددەی پێنجەم لە یاسای دەسەلاّتی دادوەری ژمارە / ١٤ سالّی ١٩٩٢ کە جەخت دەکاتە سەر بە کارهێنانی زمانی کوردی لە دادگاکان، بڕیارماندا:٠٠

١. سکالاّنامە و داواکاری و دادبینی و دادگایی کردن لە گشت دادگاکانی هەرێمی کوردستان بە زمانی کوردی بێت .

٢. کۆنووس و گوفتار لایەنە دژ کارەکان و شایەتەکان بە کوردی وەردەگێرێت .

٣. بڕیارە دادوەرییەکان بە کوردی دەردەچێت و ئەگەر زاراوەیەکی یاسایی نامۆ بوو دەتوانرێت هەر بە عەرەبی بنووسرێت یان بە زاراوەیەکی کوردی و زاراوە عەرەبییەکەی لەتەکەوە لە نێو دوو کەوانە بنووسرێت .

٤. ئەم فەرمانە لە ڕێکەوتی ٢٠٠٠/٦/٣وە کاری پێ دەکرێت .

**هـــادی عـــلی**

**وەزیـــــــــــری داد**

# ڕێنمایی ژمارە (١) ساڵی ٢٠٠٠

پشت بە دەسەڵاتی ماددەی (٦٤) لە یاسای دەسەڵاتی دادوەری ژمارە (١٤)ی ساڵی ٩٩٢، و بۆ پیادەکردنی مادەی (٥) لەهەمان یاسا، سەبارەت بەکوردی کردنی دادوەری لە دادگاکانی هەرێمی کوردستانی عێراق ، ئەو ڕێنماییانەی خوارەوەمان دەرکرد:٠٠

١ لە ڕێکەوتی ٢٠٠٠/٦/٣ بەدواوە سکاڵای داواکان (لائحە الدعوی) بەکوردی پێشکەش دادگاکان دەکرێت و کۆنووسی دادوەریش بەکوردی دەبێت.

٢ . بڕیارەکانی دادگا تا کۆتایی ساڵی ٢٠٠٠ بەعەرەبی دەردەکرێت.

٣. داواکانی پێش ٢٠٠٠/٦/٣ تاکۆتایی پێهێنانیان وەك خۆی دەمێنێتەوەو بەعەرەبی کۆنووس دەکرێت.

٤ ئەو کلێشەو فۆرمانەی بۆ بەڵگەنامەکانی دادگای باری کەسینە پێشتر گۆڕاونەتە سەر زمانی کوردی بە سەر دادگاکان و هاووڵاتیاندا بڵاودەکرێنەوە و چیتر فۆرمە کۆنەکان بەکارنایەن.

٥. لیژنەیەك پێك دەهێنرێت لە وەزارەت لە پسپۆرانی زمانەوانی و یاسایی بۆ گۆرینی کلیشەکانی دادگاکان بۆ سەر زمانی کوردی و ئامادەکردنی فەرهەنگۆکی یاسایی تایبەت بەدادگاکان.

٦. بەکوردی کردنی دادگاکانی سەر بەسەرۆکایەتی دادگای تاوانی دهۆك تاماوەیەکی تر دوادەخرێت.

**هادی علی**

**وەزیری داد**

# ڕێنمایی ژمارە / ١ ساڵی ٢٠٠٠

## دامەزراندی پرۆژەی کێڵگەی بەخێو کردنی ماسی و مۆڵەت دانی

بە پێ ی ئەو دەسەلاتەی کە پێمان دراوە لە یاسای وەزارەتی کشتوکاڵ و ئاودێری ژمارە ١٠ ساڵی ١٩٩٢ بۆ ڕێکخستن و پەرەپێدانی پرۆژەی کێڵگەی بەخێو کردنی ماسی و چۆنیەتی مۆڵەت دان بەو کەسانەی دەیانەوێ ئەو پرۆژانە جێبەجێ بکەن و بۆ ئاسان کاری ئیش و کاری ئەم پرۆژەکاریە ئەم ڕێنماییەمان دەرکرد .

**مادەی یەکەم :**

ئەم وشانەی خوارەوە ئەو واتانەی بەرامبەریان دەگرێتە خۆی : ..

١. وەزیر : وەزیری کشتوکاڵ و ئاودێری .
٢. بەڕێوەبەری گشتی : بەڕێوەبەری گشتی بەیتەرەو سامانی ئاژەڵ .
٣. بەڕێوەبەرایەتی گشتی : بەڕێوەبەرایەتی گشتی بەیتەرەو سامانی ئاژەڵ .

**مادەی دووەم :**

ڕەچاوکردنی ئەم مەرجانەی خوارەوە :..

١. داواکاری لە لایەن هاوولاتی پێشکەش دەکرێت بۆ بەڕێوەبەرایەتی بەیتەرەو سامانی ئاژەڵ لە پارێزگاکان بۆ دروست کردنی پرۆژەو لە گەڵ داواکاریەکە وێنەیەك کە پرۆژەی لە سەر دروست دەکرێت بە مەرجێك پشتگیری کرابێ لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی زەوی وزاری پارێزگا (مرتسم) .
٢. گرێبەندی کرێ ی زەوی ئەگەر هاتوو زەویە کە بە کرێ بوو یان وێنەیەك لە تاپۆی زەویەکە ئەگەر هاتوو زەویەکە موڵك بوو وەئەبێ بە ناوی داواکارەکەوە بێت ، هەروەها ڕەزامەندی شەریکەکەی ئەگەر هاتوو شەریکی هەبوو .
٣. لە بەر ئەوەی هاوولاتیانی هەندێ ناوچە (صورە قید) (تاپۆ) یان گرێ بەندی کرێی زەویان نیەو بۆ ئەوەی بتوانرێ پشت بەستن بە فەرمانگەکانی کاگێری و لە گەڵ

فەرمانگە کشتوکاڵیەکان و ئەم پشتگیریە دەبێت باوەڕی پێبکرێت (صورە قید)بۆ جێبەجێ کردنی پرۆژە لە سەر ئەو ئەرزە .

١. بەڵێنی پەسەندکراو لە لایەن (کاتب عدل) کەوا خاوەن پرۆەکە فەرمانبەرنیە لە هیچ فەرمانگەیەکی حکومەتدا فەرمانبەرنیە ، هەروەها تەمەنی لە (١٨)ساڵ کەمتر نەبێت وئەبێ ئیلتزامی تەواوی هەبێت بە هەموو رێنماییەکان کەوا پەیوەندی بە پرۆژەکەوە هەیە .

٢ .پشتگیری لە فەرمانگەی توێژینەوەی کشتوکاڵی یان هەر فەرمانگەیەکی پەیوەندیدار بهێنێ کەوا پشتگیری بکات تا چەند زەویەکە دەست ئەدات و ئایا بڕی ئاوەکە چەندە وە دابین کردنی ئاو بۆ ئەو پڕۆژەیە .

## مادەی سێیەم :

رەچاوکردنی مەرجە هونەریەکانی خوارەوە :٠٠

نابێ رووبەری زەویەکە لە (٣) دۆنم کەمتر بێت کە پڕۆژەکەی لە سەر دروست دەکرێت و رووبەری ئاوی لە (٢) دۆنم کەمتر بێت و باشترە پڕۆژەکە لە چوار حەوز دروست کرابێ و رووبەری هەر حەوزێك (٢/١) دۆنم بێت .

ئەبێ دووری لە نێوان پرۆژەی هاوشێوە (٢/١) کم بێت .

وەرگرتنی رەزامەندی ئەم فەرمانگانەی خوارەوە بۆ ئەوەی کارنەکاتە سەر پڕۆژەکانی ئەو فەرمانگانەو رێنماییەکانی ژینگەی ، مرۆڤایەتی – رێگاوبان(گرق و الجسور) – شارەوانی – شوێنەوار – گەشت و گوزار – ئاودێری و بەنداوەکان – کارەبا – گواستنەوەو گەیاندن – نەوت و کانزاکان .

**وەزیری کشتوکاڵ و ئاودێری**

# ڕێنمایی ژمارە / ٢ ساڵی ٢٠٠٠

دامەزرانـــدی پـــڕۆژەی بـــە خێـــوکردن و قەڵـــەو کردنـــی ئاژەڵـــە کاوێـــژکارەکان و دانی مۆڵەت .

**مادەی یەکەم :**

ئەم وشانەی خوارەوە ئەو واتانەی بەرامبەریان دەگرێتە خۆی :-

١. وەزیر : وەزیری کشتوکاڵ و ئاودێری .

٢. بەڕێوەبەری گشتی : بەڕێوەبەری گشتی بەیتەرەو سامانی ئاژەڵ .

٣. بەڕێوەبەرایەتی گشتی : بەڕێوەبەرایەتی گشتی بەیتەرەو سامانی ئاژەڵ .

**مادەی دووەم :**

ڕەچاوکردنی ئەم مەرجانەی خوارەوە :-

١. داواکاری لە لایەن هاووڵاتی پێشکەش دەکرێت بۆ بەڕێوەبەرایەتی بەیتـەرەو سـامانی ئـاژەڵ لە پارێزگاکان بۆ دامەزرانـدنی پـڕۆژەو لـە گـەڵ داواکاریەکـە وێنەیـەك لـە شـوێنەکە هـاوپێچ دەکرێت ، کە پڕۆژەکەی لە سەر دروست دەکرێت بە مەرجێك پشتگیری کرابێت لە لایەن بـە ڕێوەبەرایەتی زەوی‌و زارو دیاری کردنی جۆری پڕۆژەکە بۆ بە خێوکردنی چێڵی شیردەر یان بۆ بە خێوکردنی مەڕ یان بزن یان قەڵەو کردنی گۆلك یان بەرخ .

٢. گرێ بەسـتی کرێـی زەوی ئەگـەر هـاتوو زەویەکـە بـە کـرێ بـوو یـان وێنەیـەك لـە تـاپۆی زەوییەکە ئەگر هاتوو زەویەکە (ملك) بـوو و ئـەبێ بـە نـاوی داواکارەکـەوە بێـت و هـەروەها ڕەزامەندی شەریکەکانی وەربگیرێت ئەگەر شەریکی هەبوو .

٣. لـە بەرئـەوەی هاووڵاتیـانی هەنـدێ ناوچـە (صـورە قیـد) (تـاپۆ) یـان گرێبەنـدی کرێـی زەوی‌یـان نیـەو بـۆ ئـەوەی بتـوانرێ پـشت ببەسـتن بـە فەرمانگـەکانی کـارگێری و لـە گـەڵ فەرمانگـە کـشتوکاڵیەکان و ئـەم پـشتگیریە دەبێـت بـاوەڕی پـێ بکرێـت وەکـو (صورە قید) بۆ جـێ بەجـــێ کردنی پـــڕۆژە لە سەر ئـــەو ئەرزە .



٤. بەڵێنی پەسند کراو لە لایەن (کاتب عدل) کەوا خاوەن پرۆژەکە لە هیچ فەرمانگەیەکی حکومەتدا فەرمانبەر نییە و هەروەها تەمەنی ١٨ساڵ کەمتر نیەو ئەبێ ئیلتزامی تەواوی بە هەموو ڕێنماییەکان هەبێت ، کەوا پەیوەندی بە پرۆژەکەوە هەیە .

**ماددەی سێ یەم :**

رەچاوکردنی ئەم مەرجە هونەریانەی خوارەوە :٠٠

١. ڕووبەری کشتوکاڵی داواکراو بۆ چاندنی ئالیکی سەوز .

| | | |
|---|---|---|
| پرۆژەی بەخێوکردنی چێڵی شیردەر | یەك دۆنم | بۆ هەر ٥ سەر |
| پرۆژەی بەخێوکرننیمەڕ یان بزن | یەك دۆنم | بۆ هەر ٢٠ سەر |
| پرۆژەی قەڵەو کردنی گۆلك | یەك دۆنم | بۆ هەر ١٠ سەر |
| پرۆژەی قەڵەو کردنی بەرخ | یەك دۆنم | بۆ هەر ٤٠ سەر |

٢. دروست کردنی تەویلەی ساکار و لە کەرەستەی ناوەخۆیی و ڕەچاوکردنی چۆنیەتی دەرچوونی ئاو و پیسایی ئەبێ ڕووبەری بەم جۆرەی خوارەوە بێت .

| | | |
|---|---|---|
| پرۆژەی بەخێوکردنی چێڵی شیردەر | ڕووبەری داپۆشراو ٣م٢ چێڵێك | کراوە ٦ م٢ چێڵێك |
| پرۆژەی بەخێوکردنی مەڕ یان بزن | ڕووبەری داپۆشراو ١,٥ م٢بۆ یەك سەر | کراوە ٣م٢ |
| پرۆژەی قەڵەو کردنی گۆلك دابەستان | ڕووبەری داپۆشراو ٢م٢ یەك سەر | کراوە ٤م٢ |
| پرۆژەی قەڵەوکردنی بەرخ دابەستان | ڕووبەری ١,٥ م٢ یەك سەر | کراوە ١م٢ |

٣.کەمترین ڕووبەری کشتوکاڵی بۆ چاندنی بەرووبومی ئالیکی (٢ دۆنم بێت)و

ئەمـــەش کـــەمترین ڕووبـــەری کـــشتوکاڵی یـــە بـــۆ پـــرۆژەی کاوێـــژکارەکان بـــەم شـــێوەیەی خوارەوە دەبێت .

| | | |
|---|---|---|
| پرۆژەی بەخێوکردنی چێڵی شیردەر | ١٠ سەر | |
| پرۆژەی بەخێوکردنی مەڕ یان بزن | ٤٠ سەر | |
| پرۆژەی قەڵەو کردنی گۆلك دابەستان | ٢٠ سەر | |
| پرۆژەی قەڵەو کردنی بەرخ دابەستان | ٨٠ سەر | |

٤ وەرگرتنـــی ڕەزامەنـــدی ئـــەم فەرمانگانـــەی خـــوارەوە بـــۆ ئـــەوەی کارنەکاتـــە ســـەر پرۆژەکـــان و ڕێنماییـــەکان ، ژینگـــەی مرۆڤایـــەتی ، ڕێگـــاو بـــان ، شـــارەوانی ، شـــوێنەوار ، گەشـــت و گـــوزار ، ئاودێری و بەنداوەکان ، کارەبا ، گواستنەوە و گەیاندن ، نەوت و کانزاکان .

**وەزیری کشتوکاڵ و ئاودێری**

---

# ڕێنمایی ژمارە / ٣ ساڵی ٢٠٠٠

# دامەزراندنی پڕۆژەی گۆشت و مۆڵەت دانی :••

بـــە پێـــی ئـــەو دەســـەلآتەی پێمـــان دراوە لـــە یاســـای وەزارەتـــی کـــشتوکاڵ و ئـــاودێری ژمـــارە / ١٠ ســـاڵی ١٩٩٢ وە بـــۆ ڕێکخـــستن و پەرەپێـــدانی پـــڕۆژەی گۆشـــت و مۆڵـــەت دان بـــەو کەســـانەی دەیانـــەوێ ئـــەم پرۆژانـــە جێبـــەجێ بکـــەن وە بـــۆ ئاســـان کـــاری ئـــیش و کـــاری ئـــەم پڕۆژەکاریە ئەم ڕێنماییەمان دەرکرد :••

**ماددەی یەکەم :••**

ئەم وشانەی خوارەوە ئەو واتانەی بەرامبەریان دەگرێتە خۆی : ..

١. وەزیر : وەزیری کشتوکاڵ و ئاودێری .

٢. بەڕێوەبەری گشتی : بەڕێوەبەری گشتی بەیتەرە و سامانی ئاژەڵ .

٣. بەڕێوەبەرایەتی گشتی : بەڕێوەبەرایەتی گشتی بەیتەرە و سامانی ئاژەڵ .

**ماددەی دووەم :**

ڕەچاوکردنی ئەم مەرجانەی خوارەوە :..

١. داواکاری لە لایەن هاوولاّتی پێشکەش دەکرێت بۆ بەڕێوەبەرایەتی بەیتەرە و سامانی ئاژەڵ لە پارێزگاکان بۆ دامەزراندنی پرۆژە لە گەڵ داواکاری کە پرۆژەکەی لە سەر دروست دەکرێت بە مەرجێك پشتگیری کرابێ لە لایەن زەویو زار (مرتسم) .

٢. گرێ بەستی (عقد أیجار) ئەگەر هاتوو زەویەکە بە کرێ بوو یان وێنەیەك لە تاپۆی زەویەکە (صورە قید) ئەگەر هاتوو زەویەکە (ملك) بوو ئەبێ بە ناوی داواکارەکەوە بێت وە هەروەها ڕەزامەندی شەریکەکەی ئەگەر هات و شەریکی هەبوو .

٣. لە بەر ئەوەی هاوولاّتیانی هەندێ ناوچە (صورە قید) (تاپو) یان گرێ بەستی کرێی زەویان نیەو بۆ ئەوەی بتوانرێ پشت بەست بن بە فەرمانگەکانی کارگێڕی وە لە گەڵ فەرماناگە کشتوکاڵیەکان وە ئەم پشتگیریە دەبێت باوەڕی پێ بکرێت وەکو (صورە قید) بۆ جێبەجێکردنی پرۆژە لە سەر ئەو زەویە .

٤. بەڵێنی پەسند کراو (تعهد مصدق) لە لایەن (کاتب عدل) کەوا خاوەن پرۆژەکە فەرمانبەر نیە لە هیچ فەرمانگەیەکی حکومەت وە هەروەها تەمەنی لە (١٨) ساڵ کەمتر نیە وە ئەبێ ئیلتزامی تەواوی هەبێت بە هەموو ڕێنماییەکان کەوا پەیوەندی بە پرۆژەکەوە هەیە .

**مادەی سێیەم :**

أ.    ڕەچاوکردنی ئەم مەرجە هونەریانەی خوارەوە :٠٠

١.  ئەبێ دووری لە نێوان پرۆژەی هاوشێوە (٣٠٠)م بێت .

٢.  ئەبێ دووری لە نێوان پرۆژەی هەڵهێنەر (٣٠٠) م بێت .

٣.  ئەبێ دووری لە پرۆژەی کارگەی ئالیك (١٠٠) م بێت .

٤.  ئەبێ دووری لە پرۆژەی کاوێژکارەکان (٢٠٠) م بێت .

٥.  ئەبێ دووری لە پرۆژەی مریشکی دایکان و هێلکەکەر (٥٠٠) م بێت .

٦.  ئەبێ دووری لە سەر بڕخانەی مریشك (١) کم بێت .

٧.  ئەبێ دووری لە پرۆژەی (متکامل) (٥٠٠) م بێت .

ب.  وەرگرتنی ڕەزامەندی ئەم فەرمانگانەی خوارەوە بۆ ئەوەی نەبێتە ئاستەنگێك لە پێش پرۆژەکانی ئەوان و کار بکات لە ڕێنماییەکانیان . ژینگەی مرۆڤایەتی - ڕێگاو بان - شارەوانی - شوێنەوار - گەشت و گوزار - ئاودێری و بەنداوەکان - کارەبا - گواستنەوە و گەیاندن - نەوت و کانزاکان .

**وەزیری کشتوکاڵ و ئاودێری**

---

## ڕێنمایی ژمارە / ٤ ساڵی ٢٠٠٠

## دامەزراندنی پرۆژەی مریشکی دایکان و هێلکەکەر و مۆڵەت دانی .

بە پێی ئەو دەسەلاتەی کە پێمان دراوە لە یاسای وەزارەتی کشتوکاڵ و ئاودێری ژمارە ساڵی ١٩٩٢ بۆ ڕێکخستن و پەرەپێدانی پرۆژەی مریشکی دایکان و هێلکەکەر و چۆنیەتی مۆڵەت دان بەو کەسانەی دەیانەوێ ئەو پرۆژانە جێبەجێ بکەن و بۆ ئاسان کاری ئیش و کاری ئەم پرۆژەکاریە ئەم ڕێنماییەمان دەرکرد .

## ماددەی یەکەم :

ئەم ووشانەی خوارەوە ئەو دانانەی بەرامبەری دەگرێتە خۆی :··

١. وەزیر : وەزیری کشتوکاڵ و ئاودێری .

٢. بەڕێوەبەری گشتی : بەڕێوەبەری گشتی بەیتەرە و سامانی ئاژەڵ .

٣. بەڕێوەبەرایەتی گشتی : بەڕێوەبەرایەتی گشتی بەیتەرە و سامانی ئاژەڵ .

## ماددەی دووەم :

ڕەچاوکردنی ئەم مەرجانەی خوارەوە :··

١. داواکاری لە لایەن هاووڵاتی پێشکەش دەکرێت بۆ بەڕێوەبەرایەتی بەیتەرە و سامانی ئاژەڵ لە پارێزگاکان بۆ دامەزراندنی پرۆژەکە و لە گەڵ داواکاریەکە وێنەیەك لە شوێنەکە هاوپێچ دەکرێت کە پرۆژەکە لە سەر دروست دەکرێت بە مەرجێك پشتگیری کرابێ لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی زەوی و زار .

٢. گرێ بەستی کرێی زەوی (عقد أيجار) ئەگەر هاتوو زەویەکە بەکرێ بوو یان وێنەیەك لە تاپۆی زەویەکە (صوره قيد) ئەگەر هات و زەویەکە (مولك) بوو ئەبێ بەناوی داواکارەکە بێت وە هەروەها ڕەزامەندی شەریکەکەی وەربگرێت ئەگەر هاتوو شەریکی هەبوو .

٣. لە بەر ئەوەی هاووڵاتیانی هەندێ ناوچە (صوره قيد) (تابو) یان گرێ بەستی کرێی زەویان نییە وە بۆ ئەوەی بتوانرێ پشت بەستن بە فەرمانگەکانی کارگێڕی و لە گەڵ فەرمانگە کشتوکاڵیەکان وە ئەم پشتگیریە دەبێت بە هەموو ڕێنماییەکان کەوا پەیوەندی بە پرۆژەکەوە هەبێت .

## ماددەی سێیەم :··

أ. ڕەچاوکردنی ئەم مەرجە هونەریانەی خوارەوە :··

١. ئەبێ دووری لە پرۆژەی هاوشێوە ٥٠٠ م بێت .

٢. ئەبێ دووری لە پرۆژەی کارگەی ئالیك ٢٠٠ م بێت .

٣. ئەبێ دووری لە پڕۆژەی هەڵهێنەری مریشکی گۆشت ٥٠٠ م بێت .

٤. ئەبێ دووری لە پڕۆژەی سەربڕخانەی مریشك ١ کم بێت .

٥. ئەبێ دووری لە پڕۆژەی (متکامل) ٥٠٠ م بێت .

ب. وەرگرتنی ڕەزامەندی ئەم فەرمانگانەی خوارەوە بۆ ئەوەی نەبێتە ئاستێك لە پێش پڕۆژەکانی ئەواتن وە کاربکات لە ڕێنماییەکانیان .

ژینگەی مرۆڤایەتی ، ڕێگاوبان ، شارەوانی ، شوێنەوار ، گەشت و گوزار ، ئاودێری و بەنداوەکان ، کارەبا ، گواستنەوەو گەیاندن ، نەوت و کانزاکان .

**وەزیری کشتوکاڵ و ئاودێری**

---

# ڕێنمایی ژمارە / ٥ ساڵی ٢٠٠٠

## دامەزراندنی پرۆژەی ( متکامل ) ( هاوبەش ) بۆ مۆڵەت دانی :٠٠

بـــە پـــی ی ئـــەو دەســـەلاتەی کـــە پێمـــان دراوە لـــە یاســـای وەزارەتـــی کـــشتوکاڵ و ئـــاودێری ژمـــارە ١٠ ســـاڵی ١٩٩٢ بـــۆ ڕێکخـــستن و پەرەپێـــدانی پـــڕۆژەی (متکامـــل) (هاوبـــەش) بـــۆ چـــۆنیەتی مۆڵـــەت دان بـــۆ ئـــەو کەســـانەی دەیانـــەوێ ئـــەو پڕۆژانـــە جێبـــەجێ بکـــەن و بـــۆ ئاسان کاری ئیش و کاری ئەم پڕۆژەکاریە ئەم ڕێنماییەمان دەرکرد .

## ماددەی یەکەم :

ئەم ووشانەی خوارەوە ئەو دانانەی بەرامبەری دەگرێتە خۆی :٠٠

١. وەزیر : وەزیری کشتوکاڵ ئاودێری .

٢. بەڕێوەبەر گشتی : بەڕێوەبەری گشتی بەیتەرە و سامانی ئاژەڵ .

٣. بەڕێوەبەرایەتی گشتی : بەڕێوەبەرایەتی گشتی بەیتەرەو سامانی ئاژەڵ .

## ماددەی دووەم :

ڕەچاوکردنی ئەم مەرجانەی خوارەوە :٠٠

١. داواکــــاری لــــە لایــــەن هــــاووڵاتی پێــــشکەش دەکرێــــت بــــۆ بەڕێوەبەرایــــەتی بەیتــــەرەو ســــامانی ئــــاژەڵ لــــە پارێزگاکــــان بــــۆ دامەزرانــــدنی پڕۆژەکــــە وە لــــە گــــەڵ داواکاریەکــــە وێنەیــــەك لــــە شــــوێنەکە (مرتــــسم) هــــاوپێچ دەکرێــــت کــــە پڕۆژەکــــەی لــــە ســــەر دروســــت دەکرێــــت بــــە مــــەرجێك پــــشتگیری کــــرا بــــێ لــــە لایــــەن بەڕێوەبەرایــــەتی زەوی وزار (مرتــــسم) .

٢. گــــرێ بەســــتی کرێــــی زەوی (عقــــد أیجــــار) ئەگــــەر هــــاتوو زەویەکــــە بــــە کــــرێ بــــوو یــــان وێنەیــــەك لــــە تــــاپۆی زە ویەکــــە (صــــوره قیــــد) ئەگــــەر هــــاتوو زەویەکــــە (ملــــك) بــــوو ئــــەبێ بــــە نــــاوی داواکارەکــــە بێــــت وە هــــەروەها ڕەزامەنــــدی شــــەریکەکانی وەربگیرێــــت ئەگــــەر هــــات شەریکی هەبوو .

٣. لەبەر ئەوەی هاووڵاتیانی هەندێ ناوچە (صوره قید) (تاپۆ) یان گرێ بەستی کرێی زەویان نیە وە بۆ ئەوەی بتوانرێ پشت بست بن بە فەرمانگەکانی کارگێڕی وە لە گەڵ فەرمانگە کشتوکاڵیەکان و ئەم پشتگیریە دەبێت باوەڕی پێ بکرێت وەکو (صوره قید) بۆ جێبەجێ کردنی پڕۆژە لە سەر ئەو زەویە .

٤. بەڵێنی پەسندکراو (تعهد مصدق) لە لایەن (کاتب عدل) کەوا خاوەن پڕۆژەکە فەرمانبەر نییە لە فەرمانگەکانی حکومی وە تەمەنی لە (١٨) ساڵ زیاتر و ئیلتیزام بە هەموو ڕێنماییەکانی دەرچوو ئەوەی دەردەچێت جێبەجێ دەکات لە پڕۆژەکەی .

## ماددەی سێیەم :٠٠

ڕەچاوکردنی ئەم مەرجە هونەریانەی خوارەوە :٠٠

١.  نابێت ڕووبەری زەویەكە لە (١٠٠) دۆنم كەمتر بێت .

٢.  ئەبێت دووری لە نێوان پرۆژەی هاوشێوە (١) كم بێت .

٣.  ئەبێت دووری لە نێوان بازنەكانی پرۆژەكە (٤٠٠) م بێت .

٤.  دامەزرانــدنی ســەربرەخانە بــە ئــارەزووی خــاوەنی پرۆژەكــەوە هەیــە و ئــەبێ ڕووبــەری زەویەكــە لــە ١٠٠ دۆنم زیــاتر بــێ وە دووری لــە نێــوانی وە نێــوانی بازنــەكانی تــر (١) كــم بێت .

٥.  ئــەبێ دامەزرانــدنی بازنــەكانی پرۆژەكــە بــە نــزمترین ڕێــژە وە ئــەم شــێوەی خــوارەوە بێت .

## أ.  بازنەی یەكەم :

كێلگەی بەخێوكردنی دایكانی جووجەلەی گۆشت :٠٠

١.  بــەخێوكردنی (١٥) هــەزار دایكــان دابــەش كــراو بــە ســەر ســێ هــۆڵ بــە پێــوانی (١٠٠ × ١٢) م ب ڕێــژەی (٥) دایــك وە هەنــدێك كولەشــێر بــە ڕێــژەی (١٥ ٪ ) لــە تەمــەنی یــەك ڕۆژ وە (١١٪) لە تەمەنی بەرهەم هێنان و بە چڕی (٤,٥ – ٥) باڵندە ١م٢ .

٢.  یــەك هــۆڵ بــە هــەمان پێوانــە وە مواصــفات بــۆ بــەخێوكردنی جووجەلــە بــە تەمــەنی یــەك ڕۆژ تا دەست بە بەرهەم هێنان .

٣.  دووری لە نێوان هۆڵێكی و هۆڵێكی تر (٣٠) م بێت .

٤.  ئاشــێكی كێڵگــەیی بــۆ دروســت كردنــی ئالیــك وە بــە هێــزی گونجــاو لــە گــەڵ پێویــستی كێڵگە .

## ب.  بازنەی دووەم :٠٠

كێڵگەی بەخێوكردنی جووجەلەی گۆشت :٠٠

١. بەخێوكردنی (٣٠) هەزار دایك دابەش كراو بە سەر (٣) كێلگە بە دوو هۆڵ یان (٦) هۆڵ پێوانی (١٠٠×١٢) م بە ڕێژەی (٥) هەزار باڵندە و هەندێك كەلەشێر بە ڕێژەی (١٥٪) لە تەمەنی یەك ڕۆژ و (١٠٪)لە تەمەنی بەرهەم هێنان و بە چڕی (٤,٥–٥) باڵندە لە ١م٢ .
٢. دوو هۆڵ بە هەمان پێوانە وە مواصفات بۆ بەخێوكردنی جووجەلە لە تەمەنی یەك ڕۆژ تاكو سەرەتای بەرهەم .
٣. دووری نێوان هۆڵێك و هۆڵێكی تر ٢٠ م٢ بێت بۆ هەر كێڵگەیەك بە ٢ هۆڵ (هۆڵ بە دوولا) .
٤. ئاشێكی كێڵگەی بۆ دروست كردنی ئالیك و بە وزەی گونجاو و لە گەڵ پێویستی كێڵگە .

## ج. بازنەی سێ یەم : هەڵهێنەر

١. ئەبێ ووزەی هەڵهێنەرەكە (٣) ملیۆن هێلكە / ساڵ .
٢. كۆگایەكی سارد بۆ پاراستنی هێلكە لە پلەی (١٠–١٥)م٥ .

## ماددەی چوارەم :

وەرگرتنی ڕەزامەندی ئەم فەرمانگانەی خوارەوە بۆ ئەوەی كار نەكاتە سەر پرۆژەكانیان و ڕێنماییەكان .
ژینگە مرۆڤایەتی – ڕێگاوبان – شارەوانی – شوێنەوار – گەشت و گوزار – ئاودێری بەنداوەكان – كارەبا – گواستنەوەو گەیاندن – نەوت و كانزاكان .

**وەزیری كشتوكاڵ و ئاودێری**

# ڕێنمایی ژمارە / ٦ ساڵی ٢٠٠٠

# دامەزراندنی پڕۆژەی هەڵهێنەر و مۆڵەت دانی

**ماددەی یەکەم :**

ئەم ووشانەی خوارەوە ئەو دانانەی بەرامبەر دەگرێتە خۆی :٠٠

١. وەزیر : وەزیری کشتوکاڵ و ئاودێری .

٢. بەڕێوەبەری گشتی : بەڕێوەبەری گشتی بەیتەرە و سامانی ئاژەڵ .

٣. بەڕێوەبەرایەتی گشتی : بەڕێوەبەرایەتی گشتی بەیتەرەو ئاژەڵ .

**ماددەی دووەم :**

ڕەچاکردنی ئەم مەرجانەی خوارەوە :٠٠

١. داواکاری لە لایەن هاوولاّتی پێشکەش دەکرێت بۆ بەڕێوەبەرایەتی بەیتەرەو سامانی ئاژەڵ لە پارێزگاکان بۆ دروست کردنی پڕۆژە لە گەڵ داواکارەکە وێنەیەك کە پرۆژەکەی لە سەر دروست دەکرێت بە مەرجێك پشتگیری کرابێ لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی زەوی و زاری پارێزگا .

٢. گرێ بەندێ کرێی زەوی ئەگەر هات و زەوییەکە بە کرێ بوو یان وێنەیەك لە تاپۆی زەوییەکە ئەگەر هات و زەوییەکە (ملك) بوو وە ئەبێ بە ناوی داواکارەکە بێت وە هەروەها ڕەزامەندی شەریکەکانی وەربگرێت ئەگەر هات و شەریکی هەبوو .

٣. لەبەر ئەوەی هاوولاّتیانی هەندێ ناوچە (صورە قید) (تاپۆ) یان گرێ بەستی کرێی زەویان نییە بۆ ئەوەی بتوانرێ پشت بەستبن بە فەرمانگەکانی کارگێڕی لە گەڵ کشتوکاڵیەکان وە ئەم پشتگیریە دەبێت باوەڕی پێ بکرێت وەکو(صورە قید) بۆ جێبەجێکردنی پڕۆژە لە سەر ئەو زەویە .

٤. بەڵێنی پەسند کراو لە لایەن (کاتب عدل) کەوا خاوەن پڕۆژەکە فەرمانبەر نییە لە هیچ فەرمانگەیەکی

حکومەت هەروەها تەمەنی لە ١٨ ساڵ کەمتر نەبێت وە ئەبێ ئیلتزامی تەواو هەبێت بە هەموو ڕێنماییەکان کەوا پەیوەندی بە پرۆژەکەوە هەیە .

**ماددەی سێیەم :**

أ. ڕەچاوکردنی ئەم مەرجە هونەرەیانەی خوارەوە :٠٠

١. ئەبێت دووری لە نێوان پرۆژەی هاوشێوە ٥٠٠م بێت .

٢. ئەبێت دووری لە پرۆژەی مریشکی دایکان و هێلکەکەر ٥٠٠م بێت .

٣. ئەبێت دووری لە پرۆژەی مریشکی گۆشت ٣٠٠م بێت .

٤. ئەبێت دووری لە پرۆژەی کارگەی ئالیك ٢٠٠م بێت .

٥. ئەبێت دووری لە پرۆژەی متکامل (هاوبەش) ٥٠٠م بێت .

٦. ئەبێت دووری لە پرۆژەی سەربڕخانەی مریشك ١ کم بێت .

ب. ڕەزامەندی ئەم فەرمانگانەی خوارەوە وەرگیرێت بۆ ئەوەی نەبێتە ئاستەنگ لە پێش پرۆژەکانیان وە کار لە ڕێنماییەکان بکات .

ژینگە مرۆڤایەتی – ڕێگاوبان – شارەوانی – شوێنەوار – گەشت و گوزار – ئاودێری بەنداوەکان – کارەبا – گواستنەوەو گەیاندن – نەوت و کانزاکان .

**وەزیری کشتوکاڵ و ئاودێری**

## ڕێنمایی ژمارە / ٧ ساڵی ٢٠٠٠

## دامەزراندنی پرۆژەی سەربڕخانەی مریشك و مۆڵەت دانی

بە پێ ی ئەو دەسەلاتەی کە پێمان دراوە لە یاسای وەزارەتی کشتوکاڵ و ئاودێری ژمارە ١٠ ساڵی ١٩٩٢ بۆ ڕێکخستن و پەرەپێدانی پرۆژەی سەربڕەخانەی مریشك و چۆنیەتی مۆڵەت دان بەو کەسانەی دەیانەوێ ئەو پرۆژانەی جێبەجێ بکەن و بۆ ئاسان کاری ئیش و کاری ئەم پرۆژەکاریە ئەم ڕێنماییەمان دەرکرد .

**ماددەی یەکەم :**

ئەم ووشانەی خوارەوە ئەو واتانەی بەرامبەریان درگرێتە خۆی :٠٠

١. وەزیر : وەزیری کشتوکاڵ و ئاودێری .

٢. بەڕێوەبەری گشتی : بەڕێوەبەری گشتی بەیتەرە و سامانی ئاژەڵ .

٣. بەڕێوەبەرایەتی گشتی : بەڕێوەبەرایەتی گشتی بەیتەرەو ئاژەڵ .

**ماددەی دووەم :**

ڕەچاوکردنی ئەم مەرجانەی خوارەوە :٠٠

١. داواکاری لە لایەن هاوولاَتی پێشکەش دەکرێت بۆ بەڕێوەبەرایەتی بەیتەرەو سامانی ئاژەڵ لە پارێزگاکان بۆ دروست کردنی پڕۆژە لە گەڵ داواکارەکە وێنەیەك کە پڕۆژەکە لە سەر دروست دەکرێت بە مەرجێك پشتگیری کرابێ لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی زەوی و زاری پارێزگا .

٢ گرێ بەندێ کرێی زەوی ئەگەر هات و زەویەکە بە کرێ بوو یان وێنەیەك لە تاپۆی زەویەکە ئەگەر هات و زەویەکە (ملك) بوو وە ئەبێ بە ناوی داواکارەکە بێت وە هەروەها ڕەزامەندی شەریکەکانی وەربگرێت ئەگەر هات و شەریکی هەبوو .

٣ لە بەر ئەوەی هاوولاَتیانی هەندێ ناوچە (صورە قید) (تاپۆ) یان گرێ بەستی کرێی زەویان بۆ ئەوەی بتوانرێ پشت بە فەرمانگەکانی کارگێڕی وە لە گەڵ فەرمانگە کشتوکاڵیەکان ببەستن وە ئەم پشتگیریە دەبێت باوەڕی پێ بکرێت وەکو صورە قید بۆ جێبەجێکردنی پڕۆژە لە سەر ئەو زەویە .

٤. بەڵێنی پەسند کراو لە لایەن (کاتب عدل) کەوا خاوەن پڕۆژەکە فەرمانبەر نیە لە هیچ فەرمانگەکانی حکومەت هەروەها تەمەنی لە ١٨ ساڵ کەمتر نیە وە ئەبێ ئیلتزامی تەواو هەبێت بە هەموو ڕێنماییەکانی پەیوەندار بە پڕۆژەکەی جێبەجێ دەکات .

**ماددەی سێ یەم :**

أ. ڕەچاوکردنی ئەم مەرجانەی خوارەوە :٠٠

١. ئەبێ دووری لە نێوان پڕۆژەی هاوشێوە ١ کم بێت .

٢. ئەبێت دووری لە پڕۆژەی مریشکی گۆشت و هەڵهێنەر ١ کم بێت .

ت. وەرگرتنی ڕەزامەندی ئەم فەرمانگانەی خوارەوە :٠٠

ژینگە مرۆڤایەتی — ڕێگاوبان — شارەوانی — شوێنەوار — گەشت و گوزار — ئاودێری بەنداوەکان — کارەبا — گواستنەوەو گەیاندن — نەوت و کانزاکان .

**وەزیری کشتوکاڵ و ئاودێری**

---

## ژمـــارە :٣٦١

## " بــەیـــــان "

لە بەر پێویستی و بەرژەوەندی گشتی و پشت بـەو دەسـەڵاتەی مـاددە / ١٨ لـە یاسـای دەسـەڵاتی دادوەری ژمـارە / ١٤ی سـاڵی ١٩٩٢ پێـی داویـن بڕیارمانـدا ، بـە پێکهێنـانی دادگای بەرایی لە شارۆچکەی بنەسلاوە .

**هـــادی علـــی**

**وەزیـــــــــــری داد**

## بسم الله الرحمن الرحيم

**باسم الشعب**

**المجلس الوطني لكوردستان العراق**

**رقم القرار :١٢**

**تأريخ القرار :٢٠٠٠/٥/٢١**

## "قــــرار"

استناداً الى الصلاحية المخولة لنا بموجب الفقرة (٣) من المادة الثانية من القانون رقم (١٠)لسنة ١٩٩٧و بناءاً على ما شرعه المجلس الوطني لكوردستان العراق بجلسته المنعقدة بتأريخ ٢٠٠٠/٥/٢١ قررنا اصدار القرار الأتي :

١. يستمر العمل بقرار المجلس الوطني لكوردستان العراق رقم (١٢) في ١٩٩٩/٩/٢٢ مدة سنة أخرى أعتباراً من تأريخ انتهاء نفاذه .
٢. على الوزراء المختصين تنفيذ احكام هذا القرار .
٣. ينفذ هذا القرار أعتباراً من تأريخ صدوره و ينشر في الجريدة الرسمية .

**د. رۆژ نوري شاويس**
**رئيس المجلس الوطني لكوردستان العراق**

 


# وقائع كوردستان

الجريدة الرسمية لحكومة أقليم كوردستان العراق – تصدرها وزارة العدل

العدد ( ٣ ) السنة الاولى / ٦ / ٢٠٠٠م "٢٤ " گولان ٢٧٠٠ ك ١٠ ربيع الأول ١٤٢١ هـ


**في هـذا العــدد**



سعر النسخة ( ٥ ) دنانير البدالــة ( ٤٣٥٣ _ ٤٣٥٢ _ ٤٣٥١ - ٢٠٥١٢ )